# بسم الله الرحمن الرحيم

لەم نامیلکە بچووکەدا چەند ئاثارێکی سەلەف ئەهێنین کە تێیدا بۆمان ڕوون ئەکەنەوە سەلەف رحمهم الله دین و زانستیان لە کێ وەرگرتووە؟ وە ئێمەش ئەبێت لە کێ وەریبگرین؟ تایبەتمەندیەکانی کەسێک کە زانستی لێ وەرئەگیرێت چین؟ وە خۆمان لە چ جۆرە کەسێک بپارێزین؟

سوودم لە حاشیەی سەرەتاکانی کتێبی (الشَرّيعَة)ی ئیمام **الآجري ٣٦٠** ھ رحمە الله بینیوە، داواکارم لە الله تعالى کە تەنها لەپێناو خۆی و لەسەر سوننەتی پێغەمبەرەکەی ﷺ بێت، وە سوود بگەیەنێت بە ئامادەکار و خوێنەر و هیدایەتمان بدات بۆ ڕێبازی قورئان و سوننەت بە تێگەیشتنی سەلەفی ئوممەت و جێگریمان بکات لە دنیا و قیامەتدا، آمین .

١ - ئەو زانایانەی کە زانستیان لێ وەرئەگیرێت و شوێنپێیان هەڵئەگیرێت بەو جۆرەن کە حرب الكرماني (٢٨٠ ه) باسی ئەکات :

(کۆمەڵە ئیمامێکی ناسراوبوون، جێی متمانە بوون، ئەهلی ڕاستگۆیی و ئەمانەت بوون، شوێنپێیان هەڵئەگیردرا، وە لێیان وەرئەگیردرا، وە **بیدعەچی و ڕاجیاوازو عەقیدە تێکەڵ نەبوون**) .

(كتاب السنة : ٩١)

---

: لەلای سەلەف و ئەهلی سوننە و جەماعە پێوەری زانابوون بریتیە نییە لە زۆری کتێب نووسین و ڕیوایەت و مۆڵەتدان بە خەڵکی، بەڵکو بریتیە لە شوێنکەوتنی قورئان و سوننەت بە تێگەیشتنی سەلەفی ئوممەت، ئەمەش تەنها بە هیدایەتدان و کارئاسانی الله تعالى، وە پاشان خوێندنەوەی کتێبەکانی سەلەف و کارپێکردنیان ئەبێت، بەڵام لەپاش ئەوان کەسانێک ناوئەبرێن بە ئیمام و پێشەوا کە خاوەنی چەندین عەقیدەی کوفری و بیدعین .

٢ - إبراهيم الخواص (٢٩١ ه) ئەڵێت :

(زانست بە زۆریی ڕیوایەت کردن نییە، بەڵکو زانست بۆ کەسێکە کە شوێن زانست ئەکەوێت و بەکاریئەهێنێت، وە شوێن **سوننەتەکان** ئەکەوێت ئەگەرچی زانستیشی کەم بێت) .

**(سير سلف الصالحين : ١٣٢٥/٣)**

---

**: کەسێک کە شوێنکەوتەی سوننەت نەبێت هەرگیز ناکرێت بە پێشەوا و دینی لێ وەرناگرێت، وە ئەگەر بیدعەچی بوو بە بیدعەکەی ئەناسێنرێت وەکو مورجیئەکان، وە بەشێک لە خەواریج و قەدەریەکان، وە ئەگەرکافر بوو ئەوە بە کوفرەکەی ئەناسێنرێت وەکو جەهمی و موعتەزیلی وکوللابی و ئەشعەری و ماتوریدی و ڕافیزەکان، وە بەشێک لە خەواریج و قەدەریەکان، بەڵام لەلای گومڕاکان هەر کەسێک بە حسابی خۆیان خزمەتی بە دین کردبێت و شەرحی کتێبە فەرمووودەییەکانی کردبێت ئەوە ئیمامە و نابێت هیچ شتێکی پێ بووترێت ئەگەرکوفریشی هەبێت ! لەم کەناڵە خوێنەری بەشێک لە کوفرەکانیان بن لعنهم الله تعالى :**

**https://t.me/imamakany_kufr**

**https://t.me/Abu7anifa_u_ahliraiy**

## ٣ - قوام السنة الأصبهاني (**٥٣٥** هـ) ئەڵێت :

(ئەهلی سوننە ئەڵێن زانست بە زۆریی ڕیوایەتکردن نییە، بەڵکو بە شوێنکەوتن و بەکارهێنانیەتی، **شوێنی هاوەڵان و تابیعین** بکەوێت ئەگەرچی زانستیشی کەم بێت، **وە هەرکەسێک پێچەوانەی هاوەڵان و تابیعین بکات ئەوە گومڕایە ئەگەرچی زانستیشی زۆر بێت**) .

**(الحجة في بيان المحجة : ٥٠٤/٢)**

٤ - البربهاري (**٣٢٩** هـ) ئەڵێت :

(بزانە كە زانست بە زۆری ڕیوایەت و كتێب نییە، بەڵكو **زانا بريتيە لەو كەسەی شوێن قورئان و سوننەت ئەكەوێت**، ئەگەر زانست و كتێبیشی كەم بێت، **وە هەر كەسێک پێچەوانەی قورئان و سوننەت بكات ئەوە بیدعەچیە، ئەگەرچی ڕیوایەت وكتێبی زۆریشی هەبێت**) .

**(طبقات الحنابلة : ٢/٣٠)**

---

**: زۆرێک لە خەلەف وموتەئەخیرین كە خۆیان بە شوێنكەوتەی سەلەف وئەهلی ئەثەر ئەزانن كاریان بەم وتانەی سەلەف نەكردووە كە لێرەدا هاتووە، بەڵكو نازناوی (الإمام) ئەدەن بەو كەسانەی سەریان سپی كردووە لە جەهمیەت و قەبرپەرستی و پەكخستنی سیفەتەكانی الله تعالى و موخالەفەكردنی رسول الله ﷺ، تەنها لەبەرئەوەی هەندێک كتێبیان هەبووە وبە خاوەن زانست ناسرابوون .**

٥ - البربهاري (**٣٢٩** هـ) ئەڵێت :

(الله الله لە نەفست، وە دەست بگرە بە **ئەثەر و هاوەڵان ئەثەر و شوێنكەوتوو**، چونكە دین بریتیە لە لاسایی كردنەوە و شوێنپێهەڵگرتن - واتە هی رسول الله ﷺ و هاوەڵان - ، ئەوانەی پێش ئێمە لە نارِوونیدا جێیان نەهێڵاوین،

هەربۆیە شوێنپێیان هەڵبگرە و ئیسراحەت بکە، **وە تەنها ئەوە بکە و بڵێ کە ئەثەر و ئەهلی ئەثەر وتوویانە)** .

**(شرح السنة : ١٤٤)**

---

**: دینی ئێمە بریتیە لە شوێنکەوتن و شوێپێهەڵگرتنی سەلەف، نەوەک وەکو گروپە گومڕا و کافرەکان هەررۆژێک لەسەرڕێەتێک بین، یان وەکو ئەشعەری جەهمیەکان ئیمان بە کوفری کەلام بهێنین و سەری بخەین بەسەرقورئان و فەرموودەدا .**

## ٦ - حرب الكرماني (**٢٨٠** هـ) ئەڵێت :

(هەر کەسێک پێی وابێت کەوا نابێت شوێن هیچ کەسێک بکەوێت، وە لە شوێنکەوتەی هیچ کەسێک نەبێت - وەک شوێنکەوتەی هاوەڵانی رسول الله ﷺ، و تابعین و اتباعی تابعین - ، ئەمە وتەی فاسق و بیدعەچییە، **دوژمنی الله و رسولەکەی ﷺ، وە دینەکەی، وە بۆ کتێبەکەی، وە بۆ سوننەتی پێغەمبەرەکەیەتی ﷺ** .

بەمە ئەیەوێت ئەثەرەکان پووچ و بەتاڵ بکاتەوە، وە زانست و علم پەک بخات، وە ڕووناکی سوننەت بکوژێنێتەوە، وە تاک و دەگمەن بێ لە ڕەئی و بیروبۆچوون و قسە و بیدعە و خیلاف و دووبەرەکی .

لەعنەتی اللە و فریشتەکان و گشت خەڵکی لەو کەسە بێت کە ئەو قسەیە ئەکات .

ئا ئەمە پیسترین وتەی بیدعەچییەکانە، وە نزیکترینە لە گومڕایی و تیاچوون، بەڵکو ئەوە گومڕاییە، ئەوەی پێی وابێت کە نابێت شوێنکەوتەی هیچ کەس بیت، وە ئەمانە لاسایي أبا حنيفة و بشر المريسي و هاوەڵاکانیان کردووەتەوە .

کێ لەو کەسە دوژمنترە بۆ اللە کە ئەیەوێت ڕووناکی سوننەت بکوژێنتەوە، وە ئاثار و ڕیوایەتەکان پوچەڵ بکاتەوە، وە پێی وابێت کە نابێت شوێن هیچ کەس بکەوێت، وە لە دینەکەیدا شوێنی ئەوە کەوتووە کە لەپێشوو ناوم هێنان بۆت، ئەمانە پێشەوایی گومڕاین، وە سەرانی بیدعەچییەکانن، وە سەرۆکی پێچەوانەکارانن ،تورەیی اللە دابەزێتە سەر خاوەنی ئەم قسەیە) .

**(كتاب السنة : ٨٩)**

٧ - إبراهيم النخعي (**٩٦** هـ) ئەڵێت :

(هیچ شتێک بۆ ئێوە هەڵنەگیراوە شاراوە بێت لە هاوەڵان بەهۆی فەزلێکەوە کە ئێوە هەتان بێ) .

: إبراهيم النخعي رحمه الله تابيعيه، بەو شێوەیە قسە ئەکات لەگەڵ تابیعی و تابیعی تابیعیەکاندا لەکاتێکدا لە ئێمە زۆرنزیکتربوون لە رسول الله ﷺ و هاوەڵانی .

٨ - إسحاق بن راهويه (٢٤١ هـ) ئەڵێت :

**(ئێمە شوێنکەوتە و لاساییکەرەوەی پێشەوا و سەلەفە تێپەڕیوەکانمانین ڕەحمەتی الله یان لێبێت، شتێک داناهێنین کە لە قورئان و سوننەتی رسول الله ﷺ و وتەی ئیمامێکدا نەبێت) .**

**(السنة لـ الخلال : ٢١٧٩)**

---

: ئەمە قسەی ئیمامێکی موجتەهیدە کە گەیشتووەتە ئەو پلەیەی خاوەنی مەزهەبی خۆی بێت .

٩ - إبراهيم الحربي (٢٨٥ هـ) دەربارەی فەرموودەی (لە خێر و چاکەدان هەتا لەلایەن گەورەکانیانەوە زانستیان بۆ بێت) ئەڵێت :

(واتاکەی بریتیە لەوەی کەسێکی بچووک ئەگەر کاری بە **فەرموودەی رسول الله و هاوەڵان و تابیعین** کرد ئەوە گەورەیە، وە ئەگەر کەسێکی بە

تەمەنی پیر كار كاری بە وتەی **ئەبو حەنیفە** كرد و وازی لە سوننەتەكان هێنا ئەوە بچووكە) .

**(شرح أصول الإعتقاد أهل السنة والجماعة : ١٠٩)**

---

**: (فەرموودەی هاوەڵان و تابیعین) و اتە ئاثارەكانیان .**

**تەماشا بكە رحمک الله تۆبچووكیش بیت ئەگەرلەسەرمەنهەجی سەلەف بوویت ئەوە تۆ گەورەیت، ئەگەریش چەندین برِوانامە و كتێب و وانەی دەنگیت هەبێت و لەسەر مەنهەجی ئەوان نەبیت ئەوە بچووكیت .**

**١٠** - السجزي (**٤٤٤** هـ) ئەڵێت :

**(شوێنكەوتووی ئەثەر ئەبێت پێشبخرێت و ڕێزی لێ بگیردرێت،** ئەگەرچی لە تەمەندا بچووک بێت، وە خاوەنی ڕەچەڵەكێكی بەناوبانگ نەبێت، وە **پێچەوانیكاری ئەثەرئەبێت دووربخرێتەوە** ئەگەرچی تەمەنی گەورە بێت و لە خاوەن ڕەچەڵەكێكی بەناوبانگ بێت) .

**(الرسالة إلى أهل زبيد)**

## ١١ - الفضل بن زياد ئەڵێت :

(پرسیارم کرد لە أبو عبدالله - واتە ئیمام أحمد - دەربارەی لەوەی الكرابيسي دەریخستووە؟

جا دەموچاوی دا بە یەکدا و وتی : ئەو بەڵایەیان لەو کتێبانەوە تووش بوو کە دایاننا، وازیان لە فەرموودەکانی رسول الله ﷺ هێنا و ڕوویان کردنە ئەم کتێبانە) .

**(شرف أصحاب الحديث : ٦)**

## ١٢ - علي بن أبي خالد ئەڵێت :

(وتم بە أحمد بن حنبل رحمه الله ئەم پیاوە پیرە - کە لەگەڵماندا ئامادە بوو - دراوسێمە، ڕێگریم لێ کردووە لە کەسێک، حەز ئەکات قسەی تۆ دەربارەی ئەو کەسە ببیستێت، ئەویش حارث القصير واتە حارث المحاسبي ە، پێش چەندین ساڵ منت بینی لەگەڵی پێت وتم : (دامەنیشە لەگەڵی، وە قسەی لەگەڵ مەکە) ئیتر منیش هەتا ئێستا قسەم لەگەڵ نەکردووە، وە ئەم پیاوە بەتەمەنە لەگەڵی دائەنیشێت، چی دەربارە ئەڵێیت؟

جا بینیم أحمد ڕەنگی سوور هەڵگەڕا، چاو و دەمارەکانی ملی گەورەبوون، هەرگیز نەمبینیبوو بەم شێوەیە، بە دەست ڕاوەشاندن و جووڵەوە ئەیوت : (ئا

ئەوە! الله ئاوا و ئاوای لێ بکات، هیچ کەسێک ئەوە ناناسێت ئیلا کەسێک شارەزای نەبێت بەباشی، وازی لێ بهێنە، وازی لێ بهێنە، وازی لێ بهێنە، هیچ کەسێک ئەوە ناناسێت ئیلا کەسێک شارەزای نەبێت بەباشی، ئەوە المغازلي و یعقوب و فلان لەلای دانیشتن و تووشی ڕەئی جەهمی ی کردن، بەهۆیەوە تیاچوون) .

پیاوە بەتەمەنەکە پێی وت : ئەی أبا عبدالله، فەرموودە ئەگێڕێتەوە، زۆر خاوەن خشوع و بێدەنگە، ئاوا و ئاوایە .

أبو عبدالله تووڕە بوو و وتی : (**نەرمونیانی و خشوعەکەی هەڵت نەخەڵەتێنێت، کەسێکی خراپە بەوە هەڵمەخەڵەتێ کە سەری کز ئەکات، هیچ کەسێک ئەوە ناناسێت ئیلا کەسێک شارەزای نەبێت بەباشی**، قسەی لەگەڵ مەکە، هیچ ڕێز و کەرامەتێکی نییە) .

**(طبقات الحنابلة : ١٤٩/٢)**

---

**: حسين الكرابيسي و حارث المحاسبي بەهۆی کوفری کەلامەوە تووشی جەهمیەت و زەندەقە بوون، هەرگیز بە خشوع و زوهدی بیدعەچی و کافران هەڵمەخەڵەتێ چونکە ئەوەی فێڵی شەیتانە تا لە ڕێیەوە خۆیان و خەڵکی زیاتریش گومڕا بکەن .**

## ١٣ - عامر بن عبدالله بن الزبير (١٢٤ ھ) ئەڵێت :

ڕۆشتم بۆلای باوكم، وتی : لە كوێ بوویت؟

وتم : كۆمەڵەیەكەم بینیەوە كە لەوان باشترم نەبینیبوو، یادی الله تعالى یان ئەكردەوە، ھی وایان تێدابوو ئەلەرزی ھەتا لە ترسی الله تعالى ئەبوورایەوە، جا منیش لەگەڵیان دانیشتم .

وتی : (ئیتر لەمەودوا لەگەڵیان دانەنیشیت)، وای بینی كە من بەباشی تێنەگەیشتووم، بۆیە وتی : (رسول الله م ﷺ بینی قورئانی ئەخوێندەوە، وە أبو بكر و عمر م بینی قورئانیان ئەخوێندەوە ئەو شتانەیان بەسەردا نەئەھات، ئایا پێت وایە زیاتر لە أبو بكر و عمر لە الله بترسن؟) .

منیش بۆم دەركەوت بابەتەكە بەو جۆرەیە، ھەربۆیە وازم لێ ھێنان .

**(حلية الأولياء : ١٦٧/٣)**

## ١٤ - أبو بكر بن أبي شيبة (٢٣٥ ھ) ئەڵێت :

(لەلای إبن عیینة دانیشتبووین، منصور بن عمار ھات بۆلای و دەربارەی قورئان پرسیاری لێكرد، جا لێی تووڕە بوو و تێیسرەواند و داوای كۆچانەكەی كرد - تا لێی بدات - .

پێی وترا : ئەی أبا محمد ئەمە کەسێکی خواپەرستە .

وتی : واینابینم ئیللا شەیتانێک نەبێت .

**(الضعفاء لـ العقيلي : ٢١/٦)**

## ١٥ - عبدالرحمن بن عمر ئەڵێت :

لەلای عبدالرحمن بن مهدي باسی کۆمەڵەیەک لە ئەهلی بیدەع و هەوڵی زۆریان لە عیبادەت کردندا کرا، وتی : **(الله هیچ شتێک قبووڵ ناکات تەنها ئەوە نەبێت کە لەسەر سوننەتە**، پاشان ئەمەی خوێندەوە : | **وَرَهْبَانِيَّةً ٱبْتَدَعُوهَا مَا كَتَبْنَٰهَا عَلَيْهِمْ** | **(الحَدِيد : ٢٧)** .

(ئەوەی لێ وەرنەگرتن، بەڵکو هەڕەشەی لێ کردن لەسەری) .

پاشان وتی : (شوێن ڕێگەی ڕاست و سوننەت بکەوە) .

**(حلية الأولياء : ٨/٩)**

**١٦ - حميد الطويل (١٤٣ هـ)** وتی :

ڕۆشیتنە لای أبي العالية الرياحي و گەنج بووین، وتی : (موسوڵمانیەتێکی باشتان تێدا ئەبینم، ئەگەر لە حەروریەکان یان خاوەنی هەوا و ئارەزووەکان نەبن) .

**(الحجة على تارك المحجة : ٣٢٣)**

**١٧ - إبن شوذب (١٥٦ هـ)** ئەڵێت :

وتم بە كثير بن زياد : (سَمت ی فڵانەکەس چەندە چاکە!) .

وتی : (ئەوەی کە ئەیبینیت مەگەر بە کەمی نەبێت ئیللا لە خاوەن هەوا و ئارەزوویەکدایە) .

**(شرح أصول الإعتقاد أهل السنة والجماعة : ٢٤٤)**

---

**: (سَمت) واتە قسە و هەوڵسوکەت و مامەڵەکردنی لەگەڵ خەڵکی .**

**جا کە کەسێک گومڕا بوو شەیتان حەزئەکات وەکو کەسێکی زۆرباش و خواپەرست و لەخواترس دەریکەوێت بۆ ئەوەی کەسە گومڕاکە زیاتر وا بزانێت لەسەر حەقە، وە بۆ ئەوەی خەڵکی ئاسایی و نەزان پێی هەڵبخەڵەتێن و شوێنی بکەون و ئەوانیش بەخۆیەوە گومڕا بکات، وەک یەکێک لە سەلەف ئەڵێت : (ئەگەر شەیتان ئەوەی ویستی کردی، ئەوە ئەیکات**

بە تەڵەیەک تا خەڵکیی پێ ڕاو بکات، کاتێک خەڵکی تەماشای خۆی و عیبادەت و زوهد و وەرع و ئارامگریەکەی ئەکەن ئەڵێن : (ئەمە بەڕاستی لەسەر ڕێگای ڕاستە و پێکاویەتی، بەڕاستی ئەمە زانایە، بەڕاستی ئەمە بۆخواسوڵحاوە، جا شوێنی ئەکەون ! ) .

**١٨** - هەربۆیە *البربهاري* (**٣٢٩** هـ) ئەڵێت :

**(ئەگەر بینیت کەسێک زۆر عیبادەت ئەکات و هەوڵ ئەدات و خاوەنی هەوا و ئارەزووە ئەوەی لەگەڵی دامەنیشە، وە گوێ بۆ قسەکانی ڕامەگرە، وە لەگەڵیدا لەسەر یەک ڕێگا ڕێ مەکە، چونکە دڵنیا نیم لەوەی وات لێ بێت ڕێگەکەی بەباش بزانیت و لەگەڵیدا تیابچیت) .**

**(شرح السنة : ١٥٤)**

عمرو بن عبيد لعنه الله کە ئیمامی کەلام و ئیعتیزال و قەدەریەکانە باسی خشوع و زوهد و وەرعی ئەکرێت .

**١٩** - هەتا ئەگاتە ئەوەی *سفيان الثوري* (**١٦١** هـ) ئەڵێت :

(الحسن البصري أيوب السختياني بینی، وتی : (ئەمە سەرمەشقی گەنجەکانی بەسرەیە)، وە ڕۆژێک عمرو بن عبيد ی بینی وتی : (ئەمە سەرمەشقی گەنجەکانی بەسرەیە، ئەگەر شتێک دانەهێنێت) .

**(تاريخ بغداد : ١٤/٦٨)**

٢٠ - أيوب السختياني (١٣١ ھ) ئەڵێت :

(بیدعەچی بە خاوەنی عەقڵ مەزانن، هەرگیز عمرو بن عبید م بە عاقڵ نەزانیوە) .

**(الكامل في الضعفاء : ٥/٩٦)**

٢١ - عاصم الأحول (١٤٢ ھ) ئەڵێت :

لەلای قتادة دانیشتم، باسی عمرو بن عبید کرا، جا قسەی ناشرینی پێ وت .

وتم : ئەی أبو الخطاب، ئایا زانایان قسەی ناشرین بە یەکتری ئەڵێن؟

وتی : (ئەی أحول، **ئایا نازانیت کەسێک کە بیدعەیەکی داهێنا ئەوە واجبە باس بکرێت هەتا خەڵکی خۆی لێ بپارێزێت؟**)

جا لەلای قتادة هاتمەوە و زۆری گرنگیم بە قسەکەی دا دەربارەی عمرو بن عبید، نیوەڕۆ نووستم و لە خەومدا عمرو بن عبید م بینی، وە قورئان لە کۆشیدا بوو و ئایەتێکی قورئانی ئەکڕاند .

منیش وازم لێ هێنا هەتا كڕاندی، وتم : وەكو خۆی بینووسەرەوە .

وتی : ناتوانم)

**(تاريخ بغداد : ١٦/٢٠٣)**

**٢٢** - **قريش بن أنس** (**٢٠٨** ه) ئەڵێت :

(چی ئەكەیت لە عمرو بن عبید! مشتێک خۆڵ باشترە لەو) .

**(الضعفاء لـ العقيلي : ٣/٢٧٩)**

**٢٣** - وە طلق بن حبيب بەناوبانگ بوو بە عیبادەت وزوهد و چاكیەتی، **طاووس** (**١٠٦** ه) دەربارەی سوێندی ئەخوارد ئەیوت :

(تەوافم لەگەڵی ئەكرد، هیچ كەسێكم نەبینیوە هێندەی طلق بن حبیب دەنگی خۆش بێت بۆ قورئان، وە لە الله ئەترسا) .

پاش ئەوەی كە گومڕا بوو، وە بوو بە مورجیئە سەلەف ئاگاداریان لە بارەیەوە دا و حسابیان بۆ هیچ شتێكی پێشووی نەكرد .

## ٢٤ - أيوب السختياني (١٣١ هـ) ئەڵێت :

(سعيد بن جبير بينيى لەگەڵ طلق بن حبيب، وتى : بۆچی ئەتبينم لەگەڵ طلق؟ دامەنيشە لەگەڵی .

**(مسائل حرب الكرماني : ٢٣٨٦)**

## ٢٥ - عبدالعزيز بن محمد ئەڵێت :

(صفوان بن سليم برۆشتايە بەلای هەر جەنازەيەکدا نوێژی لەسەر ئەکرد، جەنازەيەکی بەلادا تێپەڕێنرا، کە گەيشتە لای دەرگاکە وتی : ئەوە کێيە؟

وتيان : عبدالله بن أبي لبيد .

جا گەڕايەوە و نوێژی لەسەر نەکرد .

سوێند بە الله زۆر عيبادەتی ئەکرد - واتە عبدالله بن أبي لبيد - ، بەڵام تۆمەتبارکرابوو بە قەدەری بوون) .

**(الضعفاء لـ العقيلي : ٢/٢٩٢)**

وە خەواريجەکان بەوە ناسراون بە زۆری عيبادەت و لەخواترسان و خوێندنەوەی قورئان بە جۆرێک هاوەڵانی رسول الله لەپاڵيانـدا هەستيان بە

کەمتەرخەمی ئەکرد، بەڵام ئەوە سوودی نەبوو بۆیان لە تووش نەبوون بە گومڕایی، هەربۆیە سەگی ئاگرن .

**٢٦** - **الآجري** لە **(كتاب الشريعة)** دەربارەیان ئەڵێت :

(خەواریجەکان کۆمەڵەیەکی خراپ، سەرپێچیکارانی - فەرمانەکانی - الله و رسول ـەکەین، **ئەگەر چی نوێژ بکەن و ڕۆژوو بگرن و زۆر عیبادەت بکەن، ئەوە سوودی نییە بۆیان، ڕاستە فەرمانکردن بە چاکە و ڕێگری کردن لە خراپە پیشان ئەدەن، بەڵام ئەوە سوودی نییە بۆیان، چونکە ئەوانە کۆمەڵەیەکن قورئان لێک ئەدەنەوە گوێرەی هەوا و ئازەووی خۆیان** .

- پاشان وتەی إبن عباس رضي الله عنهما ئەهێنێت دوای ئەوەی باسی زۆر عیبادەتکردنی خەواریجەکانی لەلا کرا کە ئەڵێت - : (خۆ لە یەهوودی و نەسڕانیەکان زیاتر عیبادەت ناکەن، وە لە هەمان کاتیشدا لەسەر گومڕایین) .

هەربۆیە وا پێویستە هەر کەسێکی عیبادەتی زۆری خەواریجێکی بینی بە خوێندنەوەی قورئانی، وە بە زۆر وەستانی لە نوێژ، وە بە بەردەوامی ڕۆژووگرتن و جوانی قسەکانی لە زانستدا هەڵنەخەڵەتێت ئەگەر لەسەر عەقیدەی خەواریجەکان بوو) .

**: تەماشا بکە رحمک الله ئیمام رحمه الله ئەڵێت : (قورئان لێک ئەدەنەوە گوێرەی هەوا وئازەووی خۆیان)، مادەم قورئانیان لێکداوەتەوە بەگوێرەی هەوا وئارەزووی خۆیان کەو اتە یان گومڕا یان کافرن، ئەشعەریە جەهمیەکان کافرن بە قورئان و فەرمووده و ئیماندارن بە کوفری کەلام، وە هەرکاتێک ڕووکەشی قورئان دژی کوفری کەلام بێت ئەوە تەحریفی ئەکەن بۆ مانایەک تا لەگەڵ کوفری کەلامدا کێشەی نەبێت، ئەم کافرانە قورئان و سوننەت لێکنادەنەوە بە هەوا و ئارەزووی خۆیان، بەڵکو لێکی ئەدەنەوە بە هەوا و ئارەزووی فەیلەسووفەکانی یۆنان چونکە بناغەی ئەوبەناوزانستەیان داناوە .**

**٢٧** - **الحسن البصري** (**١١٠** هـ) دەربارەی الفقیه واتە تێگەیشتوو لە دین ئەڵێت :

(ئایا ئەزانیت تێگەیشتوو لە دین لێیە؟ تێگەیشتوو خاوەن وەرع ە، زاهیدە، وە **جێگیرە لەسەرسوننەتی رسول الله** ﷺ) .

**(إبطال الحيل لـ إبن بطة : ٥٨)**

**٢٨** - **الضحاك** (**١٠٥** هـ) ئەڵێت :

(إبن عمر رضي الله عنهما گەیشت بە جابر بن زید لە کاتی تەوافکردن بە دەوری کەعبەدا، پێی وت : ئەی جابر، تۆ لە فەقیهەکانی بەسرەیت، وە تۆ خەڵکی

پرسیارت لێ ئەکەن، جا فتوا مەدە تەنها بە قورئان یان سوننەتێکی تێپەڕیوو نەبێت، ئەگەر وا نەکەیت ئەوە خۆت لەناوئەچیت و خەڵکیش لەناو ئەبەیت) .

**(الفقيه والمتفقه)**

**٢٩** - وە **أبي نضرة** (**١٠٨** ھ) وتی :

(أبو سلمة کە کوڕی عبدالرحمن بن عوف ە هات بۆلامان، لەماڵی أبي بشير مایەوە، منیش هاتم بۆلای الحسن و وتم : أبو سلمة هاتووە کە قازی و فەقیهی مەدینەیە، وەرە با بڕۆین بۆلای .

جا ڕۆیشتن بۆ لای، کاتێک الحسن ی بینی وتی : (تۆ کێیت؟) .

وتی : من الحسن بن أبي الحسن م .

وتی : (لەم شوێنەدا هیچ کەسێک نەبوو لە تۆ زیاتر حەزم لێبێت بینینم، چونکە پێم گەیشتوو تۆ فتوا ئەدەیت، جا لە الله بترسە ئەی حسن، وە فتوا بە خەڵکی بدە بەوەی کە پێت ئەڵێم : **فتوا ایان بۆ بدە بە شتێک لە قورئان کە بیزانیت، یان سوننەتێکی تێپەڕیوو لەلایەن پیاوچاکان و خەلیفەکانەوە، وە بزانە کامە ڕەئ و بۆچوونی خۆتە فڕێی بدە**) .

**(الفقيه والمتفقه)**

٣٠ - محمد بن عبدالوهاب ئەڵێت :

(بە علي بن عثام م وت : پیاوێک ئەڵێت فیقهـ لە فەرموودەی رسول الله ﷺ دا نییە !

وتی : ئەوە فاجرە ! بۆ فیقهـ و خێر بێجگە لە فەرموودە لە کوێدایە ؟!) .

**(ذم الكلام وأهله : ٢٣٤)**

---

**: هەموو ئەهلی سوننەیەک ئەزانێت کە سەرچاوەی حوکمە شەرعیەکان قورئان و فەرموودەیە، جا بۆ هەموو بابەتە فیقهیەکان و عەقیدەییەکان ئەبێت بگەڕیینەوە بۆ قورئان و فەرموودە بە تێگەیشتنی سەلەف، نەوەک وەکو ئەهلی ڕەئی و ئیمامەکەیان بگەڕیینەوە بۆ قیاساتی فاسد و ڕەئ و بۆچوون، وە نەوەک وەکو ئەهلی کەلامە زندیقەکان بگەڕێینەوە بۆ ئەو قاعیدە کەلامیە کوفریانەی دایانناوە و لە قورئان بە گەورەتری ئەزانن .**

بەم وتە ئاڵتوونیە کۆتایی پێ ئەهێنین إن شاء الله :

٣١ - أيوب السختياني (١٣١ هـ) وتی :

پیاوێک بە مطرف ی وت : ئێوە شتێکی باشترتان ئەوێت لە قورئان؟

وتی : (نەخێر، **بەڵکو کەسێکمان ئەوێت شارەزاتر بێت لە ئێمە بە قورئان**).

**كتاب العلم لـ أبي خيثمة : ٩٧**

---

: مەنهەجی ئەهلی سوننە و جەماعە بریتیە لە گەڕانەوە بۆ تێگەیشتنی هاوەڵان و تابیعین و ئەوانەی کە شوێنیان کەوتوون هەتا بە شێوەیەکی ڕاست لە قورئان و فەرموودە تێبگەن. چونکە باشترین تێگەیشتن بۆ ئیسلام بریتیە لە تێگەیشتنی سەلەف رحمهم الله تعالی، هەموومان ئەزانین هاوەڵان رضي الله عنهم قورئانیان خوێندووەتەوە، وە لێی تێگەیشتوون، ئایا تێگەیشتنی ئەوان بۆ قورئان و فەرموودە زیاترە؟ یان ئەوانەی پاش ئەوان؟ بێگومان تێگەیشتنی هاوەڵان زیاتر و باشترە لەبەر ئەوەی ئامادەی هاتنەخوارەوەی وەحی بوون، وە لەگەڵ رسول الله ﷺ دا بوون و زانیویانە لە چ حاڵەتێک و لەبەر چی هۆکارێک چ شتێکی فەرمووە.

**والحمدلله رب العالمين، والصلاة والسلام علي محمد**

**وعلى آله وصحبه أجمعين**

https://t.me/salafyummat

https://t.me/Hamam_alathari